


Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings

حکومەتی هەرێمی کوردستان — عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان



# پەروەردەی ئیسلامی

## پۆلی یەکەمی بنەڕەتی

حك... ...ان – عیراق
وەز...
بەڕ... ...ۆگرام و چاپەمەنییەکان




# پەروەردەی ئیسلامی

## بۆ پۆلی یەکەمی بنەڕەتی

**دانانی**

عبدالله عبدالرحمن بابان　　فاروق محمد علي عباس

صادق عثمان عارف

**وەرگێڕان لە زمانی عەرەبییەوە**

محسن جمال سید احمد بەرزنجی

**پێداچوونەوەی زانستی**

د. بشیر خلیل توفیق　　ابوبكر علي كاروانی

**پێداچوونەوەی زمانەوانی**

صادق احمد عثمان

چاپی دووەم　　١٤٣٧ کۆچی　　٢٧١٦ کوردی　　٢٠١٦ زایینی

بەناوی خودای دەهەند و دلۆڤان

## پێشەکی:

وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە پێناو پێشکەشکردنی باشترین پرۆگرام بۆ قوتابیان لە هەرێمی کوردستان، بڕیاری دا بە فەرمانی بەڕێز وەزیری پەروەردە بە دانانی پرۆگرامێکی نوێ بۆ بابەتی پەروەردەی ئیسلامی کە لەگەڵ سیستەمی پەروەردەی نوێ بگونجێت، کە لە کۆنگرەی پەروەردەیی بڕیاری لەسەردراوە.

لێژنەیەکی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە پێکهێنرا، واتە دانانی پرۆگرامێکی نوێ بگونجێت لەگەڵ تەمەنی قوتابیانی بنەڕەتی و ئامادەیی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن، لەگەڵ ڕەچاوکردنی باری کۆمەڵایەتی کوردستان، و پرۆگرامە نوێیەکە زنجیرە ئەبێت لەگەڵ پێشکەوتنی تەمەن، لەبەر ئەوەی پەروەردەی ئاینی، وەك ئەزانین، بە چەند قۆناغێك تێئەپەڕێت بە گوێرەی تەمەنی مرۆڤ، و هەروەها پرۆگرامی نوێ لە قۆناغە یەك لە دوا یەکەکانیدا پێناسەیەکی ئاینەکانی دیکە بەخۆوە ئەگرێت.

پرۆگرامی پۆلی یەکەم هەنگاوی یەکەمە لەم ڕێبازەدا، کە هیوای سەرکەوتنی بۆ ئەخوازین، ڕۆڵی مامۆستا بەڕێزەکانی تیادا بەدیار دەکەوێت بۆ پێشکەشکردنی بە شێوەیەك کە مەبەست و ئامانجەکانی تیادا جێبەجێدەکات.

چونکە قوتابی لە قۆناغی بنەڕەتی وەك لاپەڕەیەکی سپی وایە هەموو شتێکی باشی لەسەر تۆماردەکرێت و بە باشە لەسەر کۆمەڵگەکەی ڕەنگ دەداتەوە، لەبەر ئەوەی قوتابی ئەو تاکەیە کە بەخۆی دەبێتە خشتێك بۆ دروستکردنی کۆمەڵێکی گەشاوە.

و بانگەواز ئاراستەی پەروەردکارە بەڕێزەکان دەکەین بۆ سوربون لەسەر جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە پیرۆزە کە هەرگیز گومان لە دڵسۆزیان ناکرێت.

لە ئامادەکردنی ئەم پرۆگرامە پشت بە شێوەی چیرۆك بەستراوە چونکە قوتابی لەم قۆناغەدا حەزی لەم شێوازەیە، و ئەویش شێوازێکی نوێیە لە بواری پەروەردەدا، و لەم بووارەدا سوودمان لە تاقیکردنەوەکانی ولاتە دراوسێکانمان وەرگرت ، و بەمە وانەی پەروەردەی ئیسلامی ئەبێتە وانەیەکی سەرنجڕاکێش و ئارەزوومەند وا لە قوتابیانی بنەڕەتی ئەکات سورین لەسەر فێربوونی ئەو زانیارییانەی تیایەتی لە فێرکردن و ڕەفتارو ڕەوشتەکاندا، لەبەر ئەوەی هەردوو تۆخمی بە ئارەزووکردنی قوتابیانی بنەڕەتی تێدایە، وە لەسەر پەروەردکارە بەڕێزەکان پێویستە وا لە قوتابیەکانی بنەڕەت بکەن ئەم کەسایەتیانەی لە چیرۆکەکانی پەرتوکەکەدا هەن بەرجەستە بکەن تا ئەو بنەماو فێرکردنانەی کە ئامانجەکانی وانەیەك ئەنوێنێت بچەسپێت لەلایاندا.

وەخودا پەناگەی سەرکەوتنە.

لیژنەی دانان

وانەی یەکەم

# خودا پەروەردگارمانە
# خولقێنەری




زەوی

# خودا رۆزی دەرمانە



باران



کێڵگە



دار



گیانەوەر

## خودا خاوەن بەخشینەکانە.

خودا خودامە ............ خودا خودامە

خودا خولقێنەرمە......... خودا رۆزیدەرمە (رازق)مە



خوان

# موحەمەد ( د.خ ) پێغەمبەرمانە

موحەمەد پێغەمبەری خودایە

راستگۆو دەست پـــــــــاکە

ئەو خۆشەویست و یاریدەدەرە

ئــەو دەهەندە بــۆ مرۆڤایەتی

واتا: بەزەییە بۆ مرۆڤایەتی

# ئیسلام ئاینمانە

## ئاینی یەکتاپەرستییە



## ئاینی ئازادی و ڕێزگرتنی مرۆڤە

## ئاینی ئاشتییە

# ئیسلام ئاینی کارکردنە



کارگە



کێڵگە



کرێکار



بازرگانی



پەڕتوك




پێنووس



قوتابخانه

# قورئان پەڕتوکمانە

قورئان نامەی خودایە بۆ گشت مرۆڤایەتی ڕێنوێنی تێدایە.

خــودا پــــەرستییە

دادگـــەری تێـــدایە

چیڕۆکەکانی تێدایە

بــەرنـــامەی ژیانە



# بنچینەکانی ئیسلام

١- دوو گەواهیەکە*:

أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلا الله

وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله

واتە: ((گەواهی دەدەم کە خودا تاك و تەنهایە و گەواهی دەدەم کە موحەمەد پێغەمبەری خودایە)).



٢- نوێژکردن.

٣- زەکات دان.

٤- رۆژو گرتنی مانگی رەمەزان.

٥- حەجکردنی ماڵی خودا. بۆ ئەو مرۆڤەی توانای هەیە.

* شایەتمان

# بنچینەکانی باوەڕ

١- باوەڕ هێنان بەخودا.

٢- باوەڕ بوون بە فریشتەکان.

٣- باوەڕ بوون بە پێغەمبەرەکان.

٤- باوەڕ بوون بە پەڕتوکە ئاسمانیەکان.

٥- باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی.

٦- باوەڕ بوون بە قەدەر (چارەنووس)(باشی و خراپی)

# باوەڕمان بە پەڕتوکە ئاسمانیەکانە

زەبور... خودای گەورە بۆ پێغەمبەری خۆی داود (د.خ) هەناردە خوارەوە.

سوحوف... خودای گەورە بۆ پێغەمبەری خۆی ئیبڕاهیم (د.خ) هەناردە خوارەوە.

تەورات ... خودای گەورە بۆ پێغەمبەری خۆی موسا (د.خ) هەناردە خوارەوە.

ئینجیل... خودای گەورە بۆ پێغەمبەری خۆی عیسا (د.خ) هەناردە خوارەوە.

قورئان پەڕتوکی موسڵمانانە خودای گەورە بۆ پێغەمبەری خۆی موحەمەد (د.خ) ناردووە.

## ڕێزگرتنی دایباب*



**خودای گەورە فەرموویەتی: (وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا).**

(چاکە کاربە لەگەڵ دایكو باوك).

**پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لەسەربێت) فەرموویەتی: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يُوَقِّرْ كَبِيْرَنَا وَيَرْحَمْ صَغِيْرَنَا).**

(لە ئێمە نییە ئەوەی ڕێز لە گەورەمان نەگرێتو بەزەیی بە بچوکماندا نەیەت).

**مامۆستا:** بەیانیتان باش قوتابییە خۆشەویستەکانم.

پێویستە بە باشی گوێ بگرن لە ئامۆژگارییەکانی دایبابەکانتان و ئامۆژگاریەکانیان جێبەجێ بکەن لەبەر ئەوەی ڕێگەی ڕاستتان لە ژیاندا نیشاندەدەن.

ئازاد قوتابییەکی زیرەکی پۆلی یەکەمە.

---

* دایك و باوك

گـوێ لـه ئامۆژگارییـەکانی دایبـاب و مامۆسـتایانی ئـەگرێت و پابەنـدیان ئەبێت.

بە جلو بەرگی پاکەوە دێتە قوتابخانە و پاکە.

شـیلان: هـەروەها سـازانیش قوتابییـەکی گـوێ رایەڵـەو ئامۆژگارییـەکانی دایباب و مامۆستایانی جێبەجێ ئەکات.

سیروان: بەڵێ سازان هاوسێمانە و قوتابییەکی گوێ رایەڵ و خۆشەویستە لە ماڵ و قوتابخانەدا.



خودایە دایبابم بپارێزیت

**چالاکی:**

پێویستە قوتابییان دەربارەی جوڵانەوەیان لە ماڵەوە لەگەڵ دایبابیان بدوێن.

**پاڕانەوە:** خودایە دایبابم بپارێزیت.

## قوتابی راستگۆ



خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿یأَیُّهَا الَّذِیْنَ آمَنُوا إِتَّقُوا اللهَ وَکُونُوا مَعَ الصَّادِقِیْنَ﴾.

(ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خودا بترسن‌و لە گەڵ راستگۆیاندابن).

پێغەمبەر (درودو سڵاوی خودای لەسەربێت) فەرموویەتی: (عَلَیْکُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ یَهْدِي إِلَی الْبِرِّ).

(پێویستە راستگۆبن چونکە راستگۆیی رێنیشاندەرە بۆ چاکە).

کە مامۆستا چووە پۆل، بینی پەنجەرەیەك لە پەنجەرەکان شکێندراوە.

بە قوتابییەکانی گوت: کێ پەنجەرەکەی شکاند؟

بێ دەنگی باڵی کێشا بەسەر هەموو پۆلەکەدا، لە پڕ سامان هەستاو گوتی:

مامۆستا من پەنجەرەکەم شکاند!

قوتابییان سەریان سوڕما لە ئازایەتی (سامان) و دان نانی بەهەڵەکەیدا، مامۆستا لێی پرسی: چی پاڵی پێوەنای بۆ گوتنی راستی و درۆ نەکەیت؟

**سامان:** مامۆستا لەبەر ئەوەی درۆ رێگەی پێنەدراوە، وەك فێرت کردین، نابێت باوەڕدار درۆزن بێت.

**مامۆستا:** ئافەرین کوڕەکەم، راستگۆیی جوانترین رەوشتەو درۆ هەڵس و کەوتێکی ناشیرنە، وەك پێغەمبەری مەزن (درودی خودای لەسەربێت) فەرمویەتی: ((پێویستە لەسەرتان راستگۆبن چونکە راستگۆیی رێ نیشاندەرە بۆ چاکەو چاکەش رێنیشاندەرە بۆ بەهەشت)) جا کەواتە لەسەرمان پێویستە راستگۆبین لەگەڵ هەموو کەسێك و نەترسین لە گوتنی راستی، لەبەر ئەوەی تۆ دانت بە هەڵەکەتدانا و راستیت گوت بۆیە من لێم بوردی لە شکاندنی پەنجەرەکە.

**چالاکی:**

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

**راهێنان**

مامۆستا چیرۆکی (مەلەوانی درۆزن) بۆ قوتابییان دەگێڕێتەوە لەسەر شێوەی نواندنێکی کورت.

ئەم دەستەواژەیەی خوارەوە رەنگ دەکەم:

دەربازبوون لە راستگۆییدایە

# دەستپاکی کرێکارێك



پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لەسەربێت) لە نیشانەی دووڕوودا فەرمویەتی:

## (إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ).

## (گەر متمانەی پێدرا ناپاکی کرد).

**باوکی یەشار، بەباشی و چالاکی کاری کرێکاری ئەکرد لـە پێناو دابینکردنی پارەی ژیـانی بەشـێوەیەکی ڕێگـە پێـدراو بۆ خێزانەکـەی، لەگـەڵ زۆر هەژاریەکـەی بـەڵام ئـەو نمونەیەکی جوانی دەستپاکی و ڕەوشتی باش بوو. لـە بەیانییـەك کاتی کارکردنی لە ماڵێکدا جانتایەکی بچوکی دۆزییـەوە، کاتێك کردیـەوە بڕێك پارەی تێدا بوو کاتێك یەکێك لە هەڤاڵانی هەستی پێ کرد گوتی: با پارەکە لە نێوانماندا دابەش بکەین، بەڵام ئەو، ئەو شتەی بەرپـەرچ دایـەوە، و گـوتی: ئـەم پارەیـە ڕاسپاردەیەو هـی ئێمـە نییـە، پێویـستە لەسـەرمان کـە بیگەڕێنینـەوە بۆ خاوەنەکـەی، ناپاکی نیشانەی دوڕووەکانـە لەبـەر ڕۆشـنایی فـەرمودەی پێغەمبـەری مـەزن ((درودی خـودای لەسـەربێت)): ((ئەگـەر متمانەی پێ کرا ناپاکی کرد)).**

کاتی نیوەڕۆ خاوەن کارەکە هاتە لایان، باوکی یەشار چوە لای و جانتاکەی دایەوە دەستی، پیاوەکە لە دەستپاکی و راستگۆییەکەی سەری سوڕما، چونکە پارەکە وەك خۆی مابوو.

پیاوەکە سوپاسی باوکی یەشاری کرد و ویستی خەڵاتی بکات بە بڕێك پارە بەرامبەر ئەو کارەی، بەڵام باوکی یەشار ئەوەی رەتکردەوە، گوتی: سوپاس بۆ تۆ، بەڵام ئەمە ئەرکە لە سەرمان، پاراستنی راسپاردە لە ئەرکەکانی ئاینە پیرۆزەکەمانە. کاتێك خاوەن کارەکە دەستپاکی ئەو کرێکارەو رەفتاری باشی بینی، پێی گوت: بڕیارم دا داتبمەزرێنم و لە ئەمڕۆوە بە فەرمانبەر لە کۆمپانیاکەم وەك برادەرێکی دەستپاك و بەئەمەك لەگەڵمدا ئەمێنیتەوە بە درێژایی ژیان.

باوکی یەشار بە دڵخۆشی گەڕایەوە ماڵەوەو موژدەی بە ماڵەوەدا، دەست پاکیەکەی هۆی دەربازبوونی بوو لە هەژاری، سوپاسی خودایان کرد بۆ ئەم بەخششەی خودا.

**هەشق:**

**١- مامۆستا داوا لە هەندێك قوتابی دەکات کە چیرۆکێك یاگفتوگۆیەکی کورت دەربارەی پاراستنی راسپاردە بۆ وانەی داهاتوو، ئامادە بکەن.**

**٢- فەرمودەیەکی پێغەمبەرمان (درودی خودای لەسەربێت) بۆ باس دەکات دەربارەی دەستپاکی و پاداشتی دەستپاك یان ناپاکی لە پاراستنی راسپاردە.**

**٣- نێوان دوستونەکە بەیەك دەگەینم:**

| | |
|---|---|
| راستگۆیی.. | جانتایەکی پڕ لە پارەی بینییەوە. |
| باوکی یەشار.. | دەستپاکیە. |
| کرێکار (باوکی یەشار).. | راستی گوت. |

**٤- ئەم فەرمودە پیرۆزە رەنگ دەکەم:**

# لا إِيمَانَ لِمَنْ لا أَمَانَةَ لَهُ

**ئەوەی دەستپاك نەبێت بێ باوەڕە.**

## بەزەیی بە گیانەوەران



پێغەمبەر (درودو سڵاوی خودای لەسەربێت) فەرمویەتی:

**(فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبٍ صَدَقَةٌ).**

**(بەرامبەر بە هەموو گیانلەبەرێك دەتوانرێت خێر و چاکە بکرێت ).**

دایکی (بانو) هەموو شەوێك پێش نوستن چیرۆکێك بۆ منداڵەکانی دەگێڕێتەوە.

شەوێك لە شەوانی زستاندا ئەم چیرۆکەی خوارەوەی بۆ گێڕانەوە:

پیرەژنێك بێچووە پشیلەیەکی هەبوو. ڕۆڵەکانم بیروڕاتان بەرامبەر پشیلە چۆنە و چییە؟

(بانو) گوتی: ئای دایکە چەند جوانە، چاوەکانی چەند جوانن!

وە بەهزاد گوتی: ئای دایکە چەند خۆشم دەوێت؟ پەلەکە چیرۆکەکەمان بۆ تەواوبکە.

**دایکەکە گوتی:** رۆڵەکانم، پیرەژنەکە پشیلەکەی خۆش نەدەویست، رۆژێکیان لێی پەست بوو لە ژێرزەمیندا بەندی کرد.

**سۆز:** ئاخ، ئەی بەستەزمان.

**بانو:** دایکە بۆ بەم شێوەیە دڵ رەق بوو؟

**بەهزاد:** ئەی پشیلە بەستەزمانەکە چی کرد؟

**دایکەکە:** لە برسانا دەیمیاواند، ئەی گوت: میاو، میاو ((ماو، ماو)).

پیرەژنەکە بڕیاری دا کە خواردن و خواردنەوەی پێ نەدات و بەڕەڵای نەکات تا لە پاشماوەی خواردنی هاوسێکانا بخوات. پاش چەند رۆژێك دەنگی پشیلەکە بەرە بەرە نزم بوو، تا بەستەزمانە مرد.

منداڵەکان بە مردنی پشیلەکە دڵیان تەنگ بوو.

**گوتیان:** بۆ پیرەژنەکە ئەوەی کرد؟ ئایا هەموو پیرەژنێك بەم شێوەیەیە؟

دایکەکە: نەخێر، ئەی رۆڵەکانم، هەموو پیرەژنێك بەم شێوەیە نیە، بەڵکو ئەو لە خوداو لە سزای خودا نەدەترسا، دلۆڤانی بەم گیانەوەرە نەدەهات، جا ئەی خۆشەویستانم لەسەرمان پێویستە کە بە بەزەیی بین لەگەڵ گیانەوەراندا ئازاریان نەدەین، چونکە ئاینمان ئاینی دلۆڤانی و بەزەییە.

**چالاکی و مەشق:**

١- مامۆستا داوا لە گشت قوتابییان یان هەندێکیان دەکات کە هەندێك بەرجەستە یا وێنەی هەندێك گیانەوەری ماڵی بۆ وانەی داهاتوو ئامادەبکەن.

٢- داوا لە هەندێکیان دەکات لاسایی دەنگی ئەم گیانەوەرانە بکەنەوە.

٣- پۆلینکردنی قوتابییان بۆ سێ دەستە، بەشێك گیانەوەرانی خۆشدەوێت، بەشێکی دیکە گیانەوەرانی خۆش ناوێت و بەشی سێیەم لێیان دەترسێت، لەگەڵ باسکردنی هۆیەکەی.

وانەی دوازدەهەم

# بەخششەکانی خودای گەورە و سوپاسکردنی



## (وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ).

## (بەخششەکانی خودای گەورە باسبکە).

لە گەشتێکی قوتابخانەدا مامۆستای پەروەردەی ئیسلامی پرسیاری لە قوتابییان کرد، گوتی:

لێرەدا چی دەبینن، ئایا ئەو دیمەن و گیانەوەرانەتان خۆش دەوێن و دڵتان پێیان خۆش دەبێت؟



سارا گوتی: ئەی مامۆستا من دارو گوڵەکانم خۆش دەوێن، لەبەر ئەوەی ئەوان سروشت پڕ لە جوانی دەکەن، و بۆنی خۆش بڵاودەکەنەوە.

باران گوتی: من مەڕو گیانەوەرە هاوشێوەکانیم خۆش دەوێن، لەبەر ئەوەی دەنگیان ئەفسوناویە و سود لە بەروبوومەکانیان وەردەگرین.

هەندێکی دیکە گوتیان: ئێمە باڵندە و ئەو پەپولە جوانانەمان خۆش دەوێن کە لێرە زۆرن و بە ئاوازە جۆراوجۆرەکانیان گۆرانیمان بۆ دەچرن بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان گوتی: من بەشداری هەموو ئەو خۆشیەتان دەکەم، زیاتر دەڵێم: کە ئاوی کانی و جۆگەو روبارەکان هۆی هەموو ئەو جوانی و خۆشیەیە، ئەویش بناغەی ژیانە، لەبەر ئەوە پێویستە کە زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی نەکەین، پیسایی فڕێ نەدەینە ناوی.

هەموو گوتیان: سوپاس خودایە بۆ ئەو بەخششانە چونکە هەموویان لە پێناو خێرو خۆشی ئێمەدان. پێویستە کە هەڤاڵی ژینگە و زیندەوەران و خولقێنراوان بین. کە هەموویان هەڵدەستن بە پاسەوانی ژینگەو پاککردنەوەی بۆ ئێمە.

**چالاكى:**

**قوتابييەكان چەند وێنەو بەرجەستەى توخمەكانى ژینگە كۆ دەكەنەوەو لەبەردەم هەڤاڵانیاندا باسى دەكەن.**

## وانەی سێزدەهەم

# هاوکاری



مێرووە بچوکەکە لەسەر دارێکی بەرز هەڵواسرابوو ئاسوودە نەبوو چونکە بە شیلەی لقێکیانەوە نووسابوو، نەیتوانی کە دابەزێت بۆ زەوی، دڵ تەنگ بوو دەستیکرد بە گریان، کاتێك دەستە خوشکەکانی لە هەنگ و جاڵجاڵۆکەو کوللە و پەپولە گوێیان لە دەنگی بوو، پەلەیان کرد بۆ لای و یارمەتییان بۆی خستە روو کوللە گوتی: لەسەر شانم هەڵتدەگرم و دەتهێنمە خوارەوە، بەڵام مێرووەکە خستنە رووەکەی قبوڵ نەکرد لە ترسی کەوتن. هەنگەکە گوتی: لەسەر پشتم سوار بە تابتفرێنم بۆ زەوی، هەروەها ترسا و نەیویست.

هەموو بیریان لە رێگەیەکی دیکە کردەوە تا هاوکاری هەڤاڵەکەیانی پێ بکەن، جا لە پڕ جاڵجاڵۆکە هاواری کرد، گوتی: داوێك لە چنینەکەمی بۆ درێژ دەکەمەوە تا زەوی و بەهۆیەوە دێتە خوارەوە، هەموو پێشوازیان لە بیرۆکەکە کرد، مێرووەکە سوپاسی کردن بۆ ئەو هاوکارییە هەموویان لەو رۆژەوە بڕیاریان دا کە هاوکاری بکەنە دروشم بۆ خۆیان لەبەر ئەوەی هاوکاری بناغەی سەرکەوتنە.

# پاك وخاوێنی



پێغەمبەر (درودو سلاوی خودای لەسەر بێت) فەرمویەتی:

## (تَنَظَّفُوا فَإِنَّ الاسْلامَ نَظِيفٌ).

## (پاك بن چونکە ئیسلام پاکە).

تارا و ئازا و سازان و دایبابیان لەسەر مێزی نان خواردن پێکەوە دانیشتبوون، تانانی نیوەڕۆ بخۆن.

**دایکی تارا گوتی:** پێش ئەوەی دەست بە نان خواردن بکەین دەبێت چی بکەین. رۆڵەکانم؟

**خوشکی گەورە، تارا گوتی:** دەبێت دەستەکانمان پاك بشۆین.

باوکی تارا، گوتی: بەڵێ ئافەرین، ئەی کچەکەم،ئینجا هەڵسان و دەستەکانیان پاك شوشت و بۆسەر مێزی نان خواردن گەڕانەوە، کاتێك نان ئامادەبوو، باوکەکە گوتی: بەناوی خودا، هەموو ئەوەیان گوتەوە. نانیان خوارد کاتێك لە نان خواردن بونەوە گوتیان: سوپاس بۆ خودا، ئێستاش دەست و دەممان پاك بکەینەوە و هەروەها ددانەکانمان بە فلْچە و هەویری ددان بشۆین.

سازان لە ( ئـازا ) ی برای پرسی: برام بەڕێوەبەری قوتابخانە ئەمڕۆ بەیانی لە گۆڕەپانی قوتابخانە چی گوت – چونکە نەخۆش بوو نەچوو بوو بۆ قوتابخانە –

ئـازا وەڵامی دایەوە: بەڕێوەبەر ئامۆژگاری کردین پارێزگاری پاك وخاوێنی ماڵـەوە و جلوبـەرگ و خـواردن و هـەروەها قوتابخانـەش بکـەین، لیژنەیـەکی لـە قوتابیـان پێکهێنـا بـۆ هۆشـیارکردنەوەو رێنیـشاندانی هـەڤاڵانیان، داوای لـە مامۆستایەکی خۆشنووس کرد بە نووسینی چەند رێنماییەك لەسەر بابەتەکەو هەڵواسـینیان لەسـەر دیوارەکانـداو هـەمووومان دڵخۆشـبووین بـەڵێنمان پـێ دا پـەیڕەوی پاك وخاوێنی بکـەین لەبەر ئـەوەی پاك وخـاوێنی لـە باوەڕەوەیە، لـە گرنگترین هۆیەکانی تەندروستی و جەستە ساغییە.

**چالاکی و مەشق:**

١– مامۆسـتا داوا لـە قوتابییـان دەکـات کـە یـەکێکیان دەربـارەی پـاك و خـاوێنی ددانەکان بدوێت و راهێنانی ئەمە لە پۆلدا بە ئامادەکردنی (فلْچە و هەویری ددان جێبەجێ بکات).

٢– باسکردنی فەرمودەیەك یان دێڕە هۆنراوەیەك دەربارەی پاك و خاوێنی، بۆ قوتابییان.

٣– دانـانی چـەند نیـشانەیەك لەسـەر سـینگی سـێ لـە خـاوێنترین قوتابییـان و هاندانی ئەوانی دیکە بۆ ئەو دیاردەیەو دووبارە کردنەوەی ئەو فەرمانە لەگەڵ ئەوانی دیکە بەبەردەوامی.

# وانەی پازدەم

## ڕەوشتی نان خواردن



ڕۆژێکیان خانزادی هەڤاڵم بانگیکردم بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ لەماڵیان، منیش بانگکردنەکەم پەسەندکردو چوومە ماڵیان، کاتێ گەیشتمە ماڵی خانزاد سێ جار بە سوکی لە دەرگەم دا، خانزاد دەرگاکەی لێکردمەوە، سڵاوم لێکرد، سڵاوەکەی باشتر وەڵام دایەوەو داوای لێکردم بچمە ژورەوە، جا چوومە ژورەوە و لەگەڵ یەکدی دانیشتین و قسەمان کرد. کاتی نان خواردن هات لەگەڵ هەڤاڵەکەمدا لەسەر مێزی نان خواردن دانیشتم، لە پڕ دارای برای هاتە ژورەوە بۆ لامان و لەسەر مێزی نان خواردن دانیشت بێ ئەوەی دەستەکانی بشوات و دەستی بە نان خواردن کرد، بە خوشکی گوت: زۆرم لەوەو لەمە ئەوێت. هەڤاڵەکەم لە هەڵسوکەوتی براکەی سەری سوڕما، بەتایبەتی کاتێك قسەی کرد و پڕیشك لە دەمی دەهاتە دەرەوە، پاش ئەوەی کە خواردنی تەواوکرد هەڵساو لەسەر کورسییەك بەرامبەر تەلەفزیۆن دانیشت تا سەیری بەرنامەیەکی وەرزشی بکات.

## چالاكی:

- ئایا هەڵس و کەوتی دارا ڕاست بوو؟
- گەر لە شوێنی ئەو بوویتایە چیت دەکرد؟
- ئایا دەتوانیت هەندێك لە داب و نەریتەکانی نانخواردن بژمێریت؟

**من منداڵێکی موسڵمانم: پەیڕەوی داب و نەریتەکانی خواردن و خواردنەوە دەکەم.**



دەستی خۆم دەشۆم پێش خواردن



پێش ئەوەی دەست بە خواردن بکەم دەڵێم:

بسم الله



فو لە خواردنی گەرم ناکەم، بەڵکو کەمێك چاوەڕوان دەبم تا سارد بێتەوە



به دەستی ڕاست نان دەخۆم



ئەم خواردنەی پێشم دەخۆم



باش خواردن ئەجوم و بێ دەنگ دەرهێنان



هیچ لە خواردنەکە لە قاپەکەم ناهێڵمەوە



کاتێك تێر دەبم ئەڵێم: سوپاس بۆ خودا کە خواردن و ئاوی داینێ و بە موسڵمانی گێڕاین



پاش خواردن دەستەکانم ئەشۆم و دەم و ددانەکانم لە پاشماوەی خۆراك پاك دەکەمەوە بۆ پاراستنی ساغی ددانەکانم لە کلۆربوون.

**سود:**

دەستەکانم پێش و پاش نان خواردن دەشۆم، ناوی خودا دەهێنم پێش نان خواردن، خواردن باش دەجوم و هەموو ئەو خواردنەی لە قاپەکەمە تەواوی دەکەم، سوپاسی خودا دەکەم کاتێك دەستم لە نان خواردن هەڵگرت.



## راهێنان:

نیشانەی (راست) لەبەردەم وێنەی راست و (چەوت) لەبەردەم ئەو وێنەیە دابنێ کە هەڵسوکەوتی چەوت دەردەبڕێت:





## نزاو پاڕانەوە:

خودایە ئەم ڕۆزییەی بە ئێمەت بەخشیوە زیادی کەیت بۆمان.

# سەردانێك لەگەڵ باپیرم



لەگەڵ باپیرم چوم بۆ ماڵی خاڵۆم ئبراهیم.

کاتێك باپیرم دانیشت سورەتی فاتیحەی خوێند - لەبەر ئەوەی مامم داخوازی کچی خاڵمی بۆ کوڕەکەی کرد بوو - لە باپیرم پرسی بۆ ئەو سورەتەی خوێند.

**باپیرم گوتی:** شوان سورەتی فاتیحە دەستپێکی قورئانە، و لەبەر ئەوە لەم جۆرە بۆنانە دەخوێنرێت تا ببێتە سەرەتایەکی باش.

**بە باپیرم گوت:** ئەو سورەتە لەبەر دەکەم.

**باپیرم گوتی:** خودا پایەدارت بکات کوڕەکەم.

# سورەتی فاتیحە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢

ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤

إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ٱهۡدِنَا

ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ

عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ

وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧



**سود:**

سورەتی فاتیحە لە هەموو نوێژێك دەخوێنرێت، لەبەر ئەوەی سورەتی فاتیحە سوپاسی مرۆڤ دەردەبرێت بۆ خولقێنەر لەسەر بەخشینی رێنیشاندان بۆ رێگەی راست.

**چالاکی:**

- هەوڵبدە کە تێکۆشەر بیت وەك شوان و سورەتی فاتیحە لەبەر بکە.
- هەڤاڵانت بدوێنە دەربارەی هەندێك لەم بەخشانەی کە خودا بە مرۆڤی بەخشیوە.

**نزاو پاڕانەوە:**

ئەی خودا سوپاس بۆ تۆ لەسەر بەخششەکانت.

**زانیاری:**

یەکەم ئایەتەکانی قورئان لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) لە ئەشکەوتی حەڕا هاتنە خوارەوە.

# خودامان یەکە



کاتێك پێغەمبەر موحەمەد (درودی خودای لەسەربێت) بانگەوازی دەکرد بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنیا.

قورەیشیەکان لێیان دەپرسی: خودات کێیە ئەی موحەمەد؟

جا سورەتی (الاخلاص) هاتە خوارەوە تا وەڵامیان بداتەوە.

## سورەتی الاخلاص (التوحید)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ
يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤

((صدق الله العظيم))

**سوود:**

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) رایسپاردین بۆ خوێندنی سورەتی (الاخلاص) بە زۆری لەبەر ئەوەی پاداشتی خوێندنی هاوتایە لەگەڵ سێیەکی قورئان.

**چالاکی:**

- باسی هەندێك سیفەتەکانی خولقێنەر بکە.

**نزاو پاڕانەوە:**

ئەی خودای تاكو تەنیا، لە ئێمە و دایبابمان خۆش بە لە رۆژی پەسڵان.

**زانیاری:**

سورەتی (الاخلاص) هەروەها پێی دەوترێت سورەتی (التوحید).

## هەموو مین و تەقەمەنییەکان مرۆڤ دەکوژن یا بریندارى دەکەن








## ناوەڕۆك